# ناساندنی نووسەر

ناو : الإمام الحافظ جعفر بن محمد بن الحسن بن المستفاض الفريابي رحمه الله تعالى

کونیه : أبو بکر

لەدایک بووە لە (٢٠٧هـ)

وەفاتی کردووە لە (٣٠١ هـ)

لە ساڵی (٢٢٤ هـ) دەستی کردووە بە نوسینەوەی حدیث

لە دیارترین شێخەکانی : إسحاق بن راهوية، قتيبة بن سعيد، أبو بكر بن أبي شيبة، علي بن المديني ، عثمان بن أبي شيبة . . . وە زۆرێکی تر .

لە دیارترین قوتابیەکانی : أبو بكر النجاد، أبو القاسم الطبراني، أبو بكر الآجري، أبو الطاهر الذهلي . . . چەندێکی تر .

هەندێک لە بەرهەمەکانی : صفة النفاق وذم المنافقين للفريابي، أحكام العيدين للفريابي، فضائل القرآن للفريابي، القدر للفريابي، الصيام للفريابي، الفوائد للفريابي، القدر للفريابي، دلائل النبوة للفريابي .

خطيب البغدادي ئەڵێت : جعفر الفريابي قازی شاری الدينور ، جێی متمانەيە و حوجەيە ، لە هەڵگرانی علم بووە لە ئەهلی تێگەيشتن و زانياری ، ڕۆژ هەڵات و ڕۆژ ئاوا گەڕاوە بۆ علم، وە گەيشتووە بە چەندێک لە زانايان .

أبو الفضل الزهري رحمه الله ئەڵێت : كاتێک گوێم لە فريابی بوو :ئەوانەی لەوەوە ئەيان نوسيەوە نزيکەی دەهەزار کەس دەبوون سەرەڕای ئەوانەی گوێ يان لێ دەگرت ، لە کۆتاييدا کەسيان نەمانەوە تەنها من نەبێ ، پاشان فريابی دەستی کرد بەگريان .

ابو احمد بن عدي رحمه الله ئەڵێت : ئێمە ئامادەی کۆڕ و مەجليسەکانی فريابی ئەبوين ، کە دە هەزار کەس و زياتری لەخۆ دەگرت .

## کەی وازی لە گێڕنەوەی حديث هێنا؟

ئيمامی الدارقطني رحمه الله ئەفەرموێ : فريابی وازی لە گێڕانەوەی حديث هێنا لە مانگی شەوال سێسەدی هيجری.

ابو علي نەيسابوری رحمه الله ئەڵێت : چوومە بەغداد لەکاتێکدا فريابی لەژياندا مابوو ، وازی لە گێڕانەوەی حديث هێنابوو، چەند جارێک چوينە لای تا لێ يەوە بنوسينەوە بەڕاستی ئێمە بە حەسرەت و پەژارە ئەمان بينی (کە وازی هێناوە).

ئیمامی الدارقطني ئەڵێت : فریابی وەفاتی کرد لە مانگی موحەڕەم ساڵی (**٣٠١** هـ) .

رەحمەتی الله تعالی لە ئیمام ابو بكر الفريابي و لە باقی زانایانی سەلەف و ئەهلی سوونە الله تعالی پاداشتی هەرە جوان و گەورەیان بداتەوە .

## (النفاق) دوو ڕوی لەزمانەوانیدا بە واتای چی دێت؟

لە زماندا نیفاق بەواتای دەرخستنی شتێکە کە تۆ پێچەوانەی ئەوەت لەناخدا بێ و دڵت پێچەوانەی ئەوەبێ کە دەری دەخەی بەڕووکەشت .

ابن فارس لە **(مقاييس اللغة)** ئەڵێت : النِّفَاقِ، لِأَنَّ صَاحِبَهُ يَكْتُمُ خِلَافَ مَا يُظْهِرُ، فَكَأَنَّ الْإِيمَانَ يَخْرُجُ مِنْهُ، أَوْ يَخْرُجُ هُوَ مِنَ الْإِيمَانِ فِي خَفَاءٍ.

واتە : کەسی هەڵگری نیفاق پێچەوانەی ئەوە لەناخیدا ئەشارێتەوە کەبە ڕووکەشی پیشانی ئەدات، وەکو ئەوەی ئیمان لێی بچێتە دەر یان ئەو لە ئیمان بچێتە دەرەوە لە پەنهانی و شاراوەییدا .

## نیفاق له شەرعدا چیه ؟

شيخ الإسلام الإمام أحمد بن حنبل رحمه الله لە **أصول السنة** سەبارەت بە نیفاق ئەفەرموێ :

والنفاق هو الكفر : أن يكفر بالله ويعبد غيره، ويظهر الإسلامَ في العلانية، مثل المنافقين الذين كانوا على عهد رسول الله ﷺ .

النفاق = دوو ڕویی : بریتیە لە کوفر، کوفر بکەی بە الله و غەیری ئەو بپەرستی (لە پەنهانیدا) وە لە ڕووکەش و ئاشکراییدا ئیسلام دەربخەی، وەکو ئەو مونافیقانەی لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ دەژیان .

ابن كثير دەڵێت : النِّفاقُ هو إظهارُ الخيرِ وإسرارُ الشَّرِّ، وهو أنواعٌ: اعتقاديٌّ، وهو الذي يخَلِّدُ صاحِبَه في النَّارِ، وعَمَليٌّ، وهو من أكبرِ الذُّنوبِ .

النفاق : بریتیە لە دەرخستنی خەیر و چاکە (لە ڕووکەش)و شاردنەوەی شەڕ و خراپە (لەناخدا) . کە چەند جۆرێکە : (نیفاقی) اعتقادی ( گەورە ) ئەوەیە کە خاوەنەکەی بە هەمیشەیی لەئاگردا ئەمێنێتەوە وە نیفاقی عەمەلی (بچووک) کە لە گەورەترین تاوانەکانە .

# جۆرەکانی نیفاق (دوو ڕوویی)

نیفاق دوو جۆری هەیە :

یەکەم : نیفاقی بیرو باوەڕ(إعتقادي) یان نیفاقی بەدرۆخستنەوە .

دووەم : نیفاقی بچووک یان کرداری (عملي).

ئیمامی الترمذي (**٢٧٩** ھ) رحمه الله دوای ئەوەی فەرموودەیەک دێنێتەوە کە ئەمەیە (أربعٌ من كُنَّ فيه كان مُنافِقًا . . . ) .

واتە : چوار شت هەیە هەر کەسێک تێی دابن ئەوا مونافیقە .

دواتر ئیمامی الترمذي ئەفەرمووێ : واتای ئەمە لای زانایان بریتییە لە نیفاقی کردەیی (عملي)، بەڵام نیفاقی بەدرۆخستنەوە لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ هەبوو ، شتێکی لەم شێوەیەش لە حەسەنی بەسرِی گێڕدراوەتەوە کە وتویەتی : نیفاق (دوو ڕوویی) دوو جۆرە، نیفاقی کردەیی (بچووک) وە نیفاقی بەدرۆخستنەوە (گەورە) .

(أربعٌ من كُنَّ فيه كان مُنافِقًا . . . ) : (إنَّما معنى هذا عند أهل العِلم: نفاقُ العَمَلِ، وإنَّما نِفاقُ التكذيبِ على عهدِ رَسولِ اللهِ ﷺ، هكذا رُوِيَ عن الحسنِ البصريِّ شيءٌ من هذا ؛ أنَّه قال : النِّفاقُ نفاقان، نفاقُ عَمَلِ، ونِفاقُ التَّكذيبِ .

(سنن الترمذي : ٤/ ٣١٦)

إبن القيم سەبارەت بە نیفاق ئەڵێت : دوو جۆرە ، گەورەو بچووک ، گەورەکەی مانەوەی هەمیشەیی لە چین و تابقی ژێری ژێرەوەی جەهەننەم لەسەر خاوەنەکەی پێویست دەکات ئەویش ئەوەیە بۆ موسڵمانان وادەربخەی کە ئیمانت بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی هەیە، کەچی لەناخیدا داکەندراوە لەمە هەمووی وە بەدرۆی ئەخاتەوە .

قال ابنُ القَيِّم : (هو نوعانِ: أكبَرُ، وأصغَرُ؛ فالأكبَرُ: يُوجِبُ الخلودَ في النَّارِ في دَرْكِها الأسفَلِ، وهو أن يُظهِرَ للمُسلِمين إيمانَه باللهِ وملائِكَتِه وكُتُبِه ورُسُلِه واليومِ الآخِرِ، وهو في الباطِنِ مُنسَلِخٌ من ذلك كُلِّه، مُكذِّبٌ به) .

(مدارج السالكين : ٣٧٦/١)

إبن كثير ئەڵێت : النفاق بریتیە لە دەرخستنی خەیر و چاکە (لە ڕووکەش)و شاردنەوەی شەڕ و خراپە (لە ناخدا) . کە چەند جۆرێکە : (نیفاقی اعتقادی ئەوەیە کە خاوەنەکەی بە هەمیشەیی لەئاگردا ئەمێنێتەوە وە نیفاق عەمەلی کە لە گەورەترین تاوانەکانە .

النِّفاقُ هو إظهارُ الخيرِ وإسرارُ الشَّرِّ، وهو أنواعٌ: اعتقاديٌّ، وهو الذي يخَلِّدُ صاحِبَه في النَّارِ، وعَمَليٌّ، وهو من أكبرِ الذُّنوبِ .

**(تفسير ابن كثير : ١/ ١٧٦)**

كەواتە بۆمان دەركەوت دوو جۆر لە نیفاق و دوو ڕوویی بوونی هەیە یەكەمیان خاوەنەكەی كافرە و لەدینی ئیسلام چۆتەدەر كە پێی ئەوترێ نیفاقی اعتقادی ( بیر و باوەڕ ) یان تكذیب (بە درۆ خستنەوە )، ئەم نیفاقە خاوەنەكەی كوفر و شیركی لەناخیدا شاردۆتەوە بەڵام بەزمانی ئیسلام و ئیمان دەرئەخات و وا پیشان ئەدات ئیماندارە . وە جۆری دووەم نیفاقی كرداری یان عەمەلی یە كە خاوەنەكەی لە ئیسلام دەرناچێت و تاوانێكی گەورەی ئەنجام داوە كە ئەویش بریتیە لە كردنی هەندێک شت یان واز هێنان لە هەندێ شت إن شاء الله ڕوونی ئەكەینەوە .

## جۆرەکانی نیفاقی گەورە یان بەدرۆخستنەوە

نیفاقی بەدرۆخستنەوە (تکذیب) یان بیروباوەڕ (الإعتقادي) کە خاوەنەکەی کافر ئەبێت هەر وەک ابن القیم ئەڵێت : شوێنەکەی دڵە و خاوەنەکەی کافرە تاهەتایە لەناو ئاگر ئەمێنێتەوە، بەڵکو لە چینی ژێرەوەی جەهەننەمە ئەگەر تەوبە نەکات .

**(مدارج السالكين : ٣٧٦/١)**

لەم خاڵانە پێک دێت :

یەکەم : بە درۆخستنەوەی پێغەمبەر ﷺ .

الله سُبحانه وتعالى ئەفەرموێ :

| إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ | (سُورَةُ المُنَافِقُونَ : ١)

واته : كاتێك كه دووڕوان بێنه لات دەڵێن شایەتی دەدەین كه بەڕاستی تۆ پێغەمبەری الله ی وه دیاره الله دەزانێت كه تۆ ڕەوانەكراوی ئەوی وه الله شایەتی دەدات كه بێگومان دووڕووان درۆزنن .

الطبري له تەفسیری ئەم ئایەته ئەفەرموێ : الله شایەتی ئەدات كه مونافیقەكان درۆ ئەكەن لەو شایەتی دانەیان كه ئەڵێن تۆ پێغەمبەری الله ی، چونكه ئەوان بیر و باوەڕیان وا نیەو ئیمانیان پێ نیه بۆیه ئەوان درۆ ئەكەن لەو هەواڵەی كه داویانه .

والله يشهد إن المنافقين لكاذبون في إخبارهم عن أنفسهم أنها تشهد إنك لرسول الله، وذلك أنها لا تعتقد ذلك ولا تؤمن به، فهم كاذبون في خبرهم عنها بذلك.

**(تفسير الطبري)**

دووەم : سەرخستنی كافران و یارمەتی دانیان له جەنگ دژی موسڵمانان .

الله سبحانه وتعالى ئەفەرموێ : | أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ يَقُولُونَ لِإِخْوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ | (**سُورَةُ الحَشرِ**: ١١)

واته : ئايا سەرنجێکت نەداوە لەوانەی کە دووڕوو بوون ئەڵێن بەو برادەرانەیان کە بێ باوەڕ بوون لە (جوولەکە) خاوەن کتێبەکان ئەگەر دەربکرێن (لە ماڵ وخاك وئاوتان) ئێمەش لەگەڵتاندا دەردەچین وە هەرگیز گوێڕایەڵی کەس ناکەین لەدژی ئێوە وە ئەگەر جەنگتان لەگەڵ دا بکرێت بێگومان ئێمە یارمەتی ئێوە ئەدەین بێگومان الله شایەتی ئەدات کە ئەوان درۆزنن .

الطبري لەتەفسیری ئەم ئایەتە ئەڵێت : ئەگەر محمد ﷺ و ئەوانەی کە لەگەڵیدان شەڕتان لەگەڵ بکەن ئەی بەنی نضیر (کە هۆزێکی جولەکەن) ئەوا سەرتان ئەخەین بەسەریاندا .

وإن قاتلكم محمد ﷺ ومن معه لننصرنَّكم معشرَ النضير عليهم .

**(تفسير الطبري)**

سێیەم : شاردنەوەی کوفر و بێ ئیمانی لە دڵ و دەرووندا وە دەرخستنی ئیسلامەتی و ئیمان بە زوبان و بە جەستە .

الله عز وجل ئەفەرموێ : ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴾ (سُورَةُ البَقَرَةِ : ٨)

واتە : وە لەناو خەڵکیدا هەندێ کەس هەیە کەدەڵێ : بڕوامان هێناوە بە الله و بەڕۆژی دوایی لەکاتێکدا ئەوان بڕوادار نین .

الطبري سەبارەت بەم ئایەتە ئەفەرموێ : هەموو موفەسیرەکان کۆدەنگیان هەیە کە ئەم ئایەتە لەسەر کەسانێک دابەزیوە لە موناڤیقەکان ، وە ئەمەش سیفەت و ڕەوشتیانە .

دواتریش قەولی إبن مسعود و إبن عباس و مجاهد و قتادة نەقڵ ئەکات لەسەر ئەمە .

وأجمع جميع أهل التأويل على أن هذه الآية نزلت في قوم من أهل النفاق، وأن هذه الصفة صفتهم .

**(تفسير الطبري)**

چوارەم : گاڵتەکردن بە موسڵمانان، وە کاتێک لەلای ئیماندارانن ئەڵێن ئێمە ئیمانداریـن وە کاتێک ئەچنە لای کافر و موشریکەکان ئەڵێن ئێمە لەگەڵ ئێوەین .

الله جل وعلا ئەفەرموێ : ﴿ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴾ (سُورَةُ البَقَرَةِ : ١٤)

واتە : وەکاتێ (موناڤیقەکان) بگەیشتنایە بەوانەی کە بڕوایان هێناوە دەیانووت : ئێمەش بڕوامان هێناوە کاتێکیش بەتەنیا بوونایە لەگەڵ گەورە

فێڵبازەکانیان دەیانووت : ئێمە هەر لەگەڵ ئێوەین بێگومان ئێمە هەر گاڵتە ئەکەین (بەوان) .

پێنجەم : دڵگران بوون و پێناخۆش بوون بەسەرکەوتنی ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان وە دڵخۆشبوون بە شکان و ژێرکەوتن و ئازاریان .

الله تعالى دەفەرموێ : ﴿لَقَدِ ٱبۡتَغَوُاْ ٱلۡفِتۡنَةَ مِن قَبۡلُ وَقَلَّبُواْ لَكَ ٱلۡأُمُورَ حَتَّىٰ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَظَهَرَ أَمۡرُ ٱللَّهِ وَهُمۡ كَٰرِهُونَ﴾ (سُورَةُ التَّوبَةِ : ٤٨) .

واتە : سوێند بە الله (ئەو دووڕووانە) پێشتریش هەوڵیان داوە فیتنە و ئاشووب (لە نێوان ئیمانداراندا) بەرپا بکەن و چەندەها فەرمان و نەخشەیان گۆڕی بۆ ئەوەی فێڵت لێ بکەن و ورەت بڕوخێنن، هەتا الله کردی حەق هات و سەرکەوت و دینی الله پایەدار بوو، لەکاتێکدا ئەوان هەمیشە سەغڵەتن (بە پایەداری ئیسلام) .

الطبري رحمە الله سەبارەت بەم ئایەتە ئەفەرموێ : مونافیقەکان بە دەرکەوتن و زاڵبونی دینی الله و سەرخستنی تۆ لەلایەن ئەووە پێیان ناخۆشەو سەغڵەتن .

والمنافقون لظهور أمر الله ونصره إياك كارهون.

(تفسير الطبري)

(تفسير الطبري)

الله سبحانه وتعالى ئەفەرموێ :

| إِن تُصِبْكَ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُواْ قَدْ أَخَذْنَآ أَمْرَنَا مِن قَبْلُ وَيَتَوَلَّواْ وَّهُمْ فَرِحُونَ | (سُورَةُ التَّوبَةِ : ٥٠) .

واتە : ( ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر خێرو چاکەیەکت تووش بێت، ئەوە ئەوان پێی دڵتەنگ و سەغڵەت دەبن، خۆ ئەگەر بەڵاو ناخۆشیەکت تووش بێت ئەوە دەڵێن: ئێمە پێشتر دەستی خۆمانمان وەشاند (باشمان کرد نەچووین بۆ جەنگ، پێشبینی ئەمەمان دەکرد)، ئەوسا پشت هەڵدەکەن لە کاتێکدا ئەوان دڵخۆش و شادوومانن !.

البغوي سەبارەت بەم بەشەی ئایەتەکە ئەڵێت : | وَّهُمْ فَرِحُونَ | : ئەوان دڵخۆش و شادوومانن بەو بەڵا و موسیبەتانەی کە بەسەرت دێن .

| وَّهُمْ فَرِحُونَ | مسرورون بما نالك من المصيبة.

(تفسير البغوي)

ئەمانە بریتین لە دیارترین خاڵ و جۆرەکانی نیفاقی گەورە (تکذيب کە ئەوەی هەر یەکێک لەمانەی تێدابێت کافرەو لەدینی ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە بۆیە با هەر یەکێکمان جوان تەماشای خۆمان کەین و خۆمان لەو دەردە کوشندەیە بپارێزین و پەنا بە الله تعالى بگرین لە دوو ڕوویی

.

## مونافیقەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ

ئەوانەی کە نیفاقی بەدرۆخستنەوە و بیروباوەڕیان هەبوو وە کافر بوون لەناو دڵ و ناخیاندا وە بەزمان و ڕووکەشیان ئیسلامیان دەر ئەبڕی و پیشانیان ئەدا لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ زۆر بوون چ پیاو چ ئافرەت .

السمعاني لە تەفسیرەکەی ئەڵێت : لە هەندێک لە گێڕانەوەکانی إبن عباس رضي الله عنه هاتووە کە ژمارەی پیاوە مونافیقەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ سێسەد کەس بوون، وە ژمارەی ئافرەتەکان سەد و حەفتا کەس بوون .

**(تفسير السمعاني : ٣٢٥/٢)**

سەرکردەکەیان عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو کە گەورەی هۆزەکانی ئەوس و خەزرەج بوو لە جاهیلیەتی پێش ئیسلام ، وە ناوی هەموویان لای حذیفەی کوڕی یەمان بوو رضي الله عنه کە بە خاوەنی نهێنی پێغەمبەر ﷺ ناودەبرێت، ئەمەش هەندێکیان کە إبن هشام باسی کردوون لە سیره ئەوانیش ئەمانەن :

ئەوانەی کە مونافیق بوون لە هۆزەکانی (الأوس) و (الخزرج) دیارترینیان ئەمانە بوون :

جُلَاس بن سويد بن الصامت.

الحارث بن سويد بن الصامت.

بُجاد بن عثمان بن عامر.

نبتل بن الحارث.

أبو حبيبة بن الأزعر.

وديعة بن ثابت .

خِذام بن خالد.

عمرو بن مالك بن الأوس.

كعب بن الحارث بن الخزرج.

الضحاك بن ثابت.

رافع بن وديعة.

زيد بن عمرو.

عمرو بن قيس.

قيس بن عمرو بن سهل.

**(سيرة إبن هشام ص : ٥١٩)**

وە ئەوەی جێگای باسە ئەم مونافیقانە سەرەڕای ئەوەی کافر بوون بەڵام نەکوژران چونکە بەزمانیان ئیسلامیان دەر ئەبڕی وە لە ڕووکەشیان ئیسلامیان پیشان ئەدا تەنانەت لە پشت پێغەمبەر ﷺ نوێژیان دەکرد بەڵام کوفرەکەیان لەناخیاندا حەشار دابوو و نەدەناسران تا الله تعالی بۆ پێغەمبەر ﷺ ئاشکرای کردن . بۆیە مونافیقەکان بەهۆی ئەو ئیسلامەی دەری ئەخەن خوێنیان پارێزراوە و ناکوژرێن و لە دونیادا حسابی موسڵمانیان بۆ ئەکرێت تا ئەو کاتەی کوفرێکی ڕوون و ئاشکرایان لێ ئەبینرێت .

کاتێک عبدالله ی کوڕی سەلول وتی : ئەگەر بگەڕێینەوە مەدینە ئەوا ئەوانەی کە باڵادەستن زەلیلەکان ئەکەنە دەرەوە، ئیمامی عمر فەرمووی ئەی پێغەمبەری الله ﷺ ئایا ئەو پیس و چەپەڵە نەکوژین؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : نەخێر چونکە خەڵکی ئەڵێن ئەو هاوڵانی خۆی ئەکوژێت .

**رواه البخاري (٣٣٣٠)، ومسلم (٢٥٨٤)**

ئیمامی شافعی رحمه الله ئەفەرموێ : ئەوەی ئیمان دەر بخات لەدوای کوفر ئەوا حوکمی موسڵمانی بەسەر ئەدرێ لە میرات و نیکاح و جگەلەمانە لە ئەحکامی موسڵمانان .

**(الأم : ٦/ ١٥٧)**

وه له (عقيدة الرازيين) هاتووه كه إبن ابي حاتم له باوكی خۆی و أبو زرعة نەقڵ ئەكات ئەوانيش له زانايانی سەردەمی خۆيان نەقڵی ئەكەن ، ئەڵێن : خەڵكی ئيماندارن له ئەحكام و ميراتگرتنيان وه ئێمه نازانين ئەوان لای الله حاڵيان چۆنه (واته نازانين دڵيان چی تێدايه نيفاق و كوفر يان ئيمان و ئيسلام) .

هەر بۆيه موونافيق حوكمی موسڵمانی لەسەر ئەدرێت مەگەر كوفرێك بكات ئاشكراو ڕوون بێت و شاهێد هەبن ئينجا ئيستيتابه ئەكرێ گەر نەگەڕايەوه و له كوفرەكەی تەوبەی نەكرد ئەوا ئەكوژرێ .

## جۆرەکانی نیفاقی بچووک

نیفاقی بچووک کە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەرناچێت بەڵام تاوانێکی گەورەی ئەنجام داوە وەکو باسمان کرد زۆر جۆری هەیە بەڵام دیارترین جۆرەکانی چوار دانەن و زیاتر جەختیان لێ کراوەتەوە هەر وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ :

چوار خوورەوشت هەن ئەوەی لەخۆیان بگرێ ئەوا مونافیقێکی تەواوە، وە هەر کەسێک خاڵێکی لەمانە تێدابێت ئەوا بەشێک لە نیفاق تێدایە تا دەستبەرداری ئەبێت، ئەگەر بە دەستپاک دابنرێ خیانەت ئەکات، وە ئەگەر قسەی کرد درۆ ئەکات، وە ئەگەر بەڵێن و پەیمان بدات ئەوا ئەیشکێنێ، وە ئەگەر کێشە و جیاوازی لەگەڵ کەسێک هەبێ ئەوا لەحەق لائەداو درۆ ئەکات .

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : (أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا، وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْ النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا : إِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ، وَإِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ) .

**رواه البخاري (٣٤) ومسلم (٥٨)**

کەواتە ئەمانە دیارترین جۆرەکانی نیفاقی عەمەلین کە خاوەنەکەی کافر نابێت هەر وەک ئیمامی الترمذي رحمه الله باسی کرد لە پۆستەکانی پێشوو وتەکەیمان هێنا، بەڵام بە ئەنجام دانی تاوانێکی گەورەی ئەنجام داوە کە خۆی شایەنی عەزاب و ئاگر کردووە ، وە هەر ئەم جۆرەی نیفاقیش بوو کە هاوەڵان رضي الله عنهم ترساون لەوەی تێیان دابێت و هەڵیان گرتبێ .

إبن أبي مليكة کە لە تابعینە ئەفەرموێ :

گەیشتم بە سی کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کە هەموویان لەخۆیان ئەترسان لەوەی دووڕوویی و نیفاقیان هەبێت .!!

عن ابْن أَبِي مُلَيْكَةَ قَال: أَدْرَكْتُ ثَلاَثِينَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كُلُّهُمْ يَخَافُ النِّفَاقَ عَلَى نَفْسِهِ.

**(أخرجه البخاري معلقًا، كتاب: الإيمان)**

## دەستپێکی کتێب

ئیمامی الفريابي رحمه الله ئەفەرموێ :

### بابێک لەوەی گێڕدراوەتەوە سەبارەت بە سیفەتی مونافیق وە هەر کەسێک سێ خەسڵەتی تێدابێت ئەوا بەڕاستی مونافیقە (بە نیفاقی بچووک)

١ - پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ : (نیشانەکانی کەسی دووڕوو (مونافیق) سیانن : ئەگەر قسەی کرد درۆ ئەکات ، وە ئەگەر وەعد و بەڵێن بدات نایباتە سەر، وە ئەگەر بەدەسپاک دانرا خیانەت ئەکات) .

٢ - پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ : (لە نیشانەکانی کەسی دووڕوو (مونافیق) سیانن : ئەگەر قسەی کرد درۆ ئەکات ، وە ئەگەر وەعد و بەڵێن بدات نایباتە سەر ، وە ئەگەر بە دەسپاک دانرا خیانەت ئەکات) .

٣ - هەمان شتە وەکو فەرموودەی یەکەم .

٤ - پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ : (سێ (سیفەت) هەن ئەوەی لەخۆیان بگرێ ئەوا مونافیقە ، ئەگەر قسەی کرد درۆ ئەکات ، وە ئەگەر وەعد و بەڵێن بدات نایباتە سەر ، وە ئەگەر بەدەسپاک دانرا خیانەت ئەکات) .

پیاوێک وتی : ئەی پێغەمبەری الله ئەگەر دووانیان لابچن و یەکێکیان بمێنێتەوە ؟

فەرمووی : (جا بەڕاستی بەشێک لە نیفاق کەوتۆتە سەری و تیایەتی تا هەر یەکێک لەمانە (لەو سیفەتانە) بمێنێ) .

٥ - پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ : (سێ (سیفەت) هەن ئەوەی لەخۆیان بگرێ ئەوا مونافیقە ، خۆ ئەگەر ڕۆژوو بگرێ و نوێژیش بکات و بانگەشەی ئەوەش بکات کە موسڵمانە ، ئەگەر قسەی کرد درۆ ئەکات ، وە ئەگەر وەعد و بەڵێن بدات نایباتە سەر، وە ئەگەر بەدەسپاک دانرا خیانەت ئەکات) .

---

ڕوونکردنەوەی یەکەم :

ئەوەی بە دەسپاک و ئەمین دانرا و خیانەتی کرد مەبەست پێی لەو جۆرە کەسانەیە کە خیانەت لە ئەمانەت ئەکەن ، جا ئەوئەمانەتە چ قسەیەک بێ پێت وتبێ لای کەس باسی مەکە ، یان پارەو شتی مادی لای کەسێک دابنێی و لات ئەمین بێ

**کەچی خیانەت لەو ئەمانەتە بکات ئەوا نیشانەی کەسی مونافیقەو لە گەورەترین تاوانەکانە .**

**دووەم : کە ئەفەرموێ ئەگەر ڕۆژووش بگرێ و نوێژیش بکات و بانگەشەی ئەوە بکات کە موسڵمانە ، مەبەستی پێ ئەوەیە کە ئەو کەسە موسڵمانێکی تەواو نیە بەڵکو مونافیقە بە نیفاق کردەیی کە خاوەنەکەی کافر نابێت بەڵام تاوانێکی گەورەی ئەنجام داوە هەروەک لە ڕابردوو ڕوونمان کردەوە .**

٦ - ابن معمر گوێی لێبوو سعیدی کوڕی مُسیَب پرسیاری لە پیاوێک ئەکرد : ئایا چۆن پێت گەیشتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : نیشاکانی مونافیق ؟

وتی : ئەگەر قسەی کرد درۆ ئەکات، وە ئەگەر وەعد و بەڵێن بدات نایباتە سەر ، وە ئەگەر بەدەستپاک دانرا خیانەت ئەکات .

لە پاشاندا پیاوێک بەلایدا تێپەڕی بەهەمان شێوە لێی پرسی جا (پیاوەکە) هەمان شتی پێگوت تاوەکو دوو پیاو بەلایدا تێپەڕین .

٧ - هەمان شتە وەکو فەرموودەی یەکەم .

٨ - عبداللە ی کوڕی مسعود رضي الله عنه ئەفەرموێ : سێ (سیفەت) هەن ئەوەی لەخۆیان بگرێت ئەوا مونافیقە، درۆزنە کاتێک قسە ئەکات، بەڵێن شکێنە کاتێک بەڵێن ئەدات، خیانەتکارە کاتێک بە دەستپاک

و ئەمین دائەنرێ . جا ئەگەر خووڕەوشتێکی لەمانە تێدابێت ئەوا سیفەتێکی تێدایە لە دووڕوویی تا ئەو کاتەی دەسبەرداری ئەبێت .

٩ - عبدالله ی کوڕی مسعود رضي الله عنه ئەفەرمووێ : سێ (سیفەت) هەن ئەوەی لەخۆیان بگرێ ئەوا مونافیقە، ئەگەر قسەی کرد درۆ ئەکات، وە ئەگەر وەعد و بەڵێن بدات نایباتە سەر، وە ئەگەر بەدەسپاک دانرا خیانەت ئەکات .

وە عبدالله کوڕی عەمری کوڕی عاص رضي عنهما فەرمووی : وەئەگەر پەیمان لەگەڵ کەسێک ببەستێ ئەوا غەدر و خیانەتێ لێ ئەکات .

---

**ڕوونکردنەوە : بۆ نموونە تۆ گرێبەست لەگەڵ موسڵمانێک یان کافرێک ئەکەی تا ساڵێک بۆ دووکانەکەت پێداویستیەکانت لە مەخزەنی ئەو ببەی و لێی بکڕی کەچی بەبێ عوزر پەیمانەکەت ئەشکێنی و خیانەتی لێ ئەکەی و لای کەسێکی تر ئەیکڕی .**

١٠ - عبدالله ی کوڕی مسعود رضي الله عنه ئەفەرموێ : مونافیق بەسێ (سیفەت) تاقی بکەنەوەو بیان ناسنەوە : ئەگەر قسەی کرد درۆ ئەکات، وە ئەگەر وەعد و بەڵێن بدات نایباتە سەر، وەئەگەر پەیمان لەگەڵ کەسێک ببەستێ ئەوا غەدر و خیانەتێ لێ ئەکات .

پاشان ئەم ئایەتانەی خوێندنەوە :

| وَمِنۡهُم مَّنۡ عَٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنۡ ءَاتَىٰنَا مِن فَضۡلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ | (سُورَةُ التَّوبَةِ : ٧٥)

واتە : وە لەناپاکان کەسانێک هەن کەپەیمانیان داوە بە الله سوێند بەخوا ئەگەر (الله) لە فەزڵ و بەهرەی خۆی پێمان ببەخشێت ئەوە بێگومان خێر وچاکە دەکەین وە بێگومان لە چاکەکاران دەبین .

| فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضۡلِهِۦ بَخِلُواْ بِهِۦ وَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعۡرِضُونَ | (سُورَةُ التَّوبَةِ : ٧٦)

واتە : کەچی کاتێک الله عز وجل لە فەزڵ و بەهرەی خۆی پێی بەخشین ڕژدی و چروکیان تێداکرد و پشتیان هەڵکرد لەکاتێکدا ئەوانە ڕوو وەرگێڕن .

| فَأَعۡقَبَهُمۡ نِفَاقٗا فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ يَلۡقَوۡنَهُۥ بِمَآ أَخۡلَفُواْ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ | (سُورَةُ التَّوبَةِ : ٧٧)

واتە : ئەمجا الله سەرئەنجامی ئەوانی گێڕا بەدوو ڕوویی لە دڵیاندا هەتا ئەو ڕۆژەی بەدیداری (الله) دەگەن بەهۆی نەبردنەسەری ئەو بەڵێنەی کەدابوویان بە الله و بەهۆی ئەوەشەوە کەدرۆیان دەکرد .

١١ - پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ : (کەسی مونافیق سێ شت لەخۆ ئەگرێت خۆ ئەگەر نوێژیش بکات و بەڕۆژوو بێ و بانگەشەی ئەوەش بکات

كە موسڵمانە : ئەگەر قسەی کرد درۆ ئەکات، وە ئەگەر بەڵێن بدات نایباتە سەر، وە ئەگەر بەدەستپاک و ئەمین دانرا خیانەت ئەکات) .

**١٢** - هەمان شتە وەکوو فەرموودەی پێنجەم .

**١٣** - پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ : (چوار (سیفەت) هەن ئەوەی لەخۆیان بگرێ ئەوا موناڤیقە، وە ئەگەر یەکێکیانی تێدابێت ئەوا بەشێکی لە دووڕوویی تیایە تا ئەو کاتەی دەسبەرداری ئەبێت : ئەگەر قسە بکات درۆ ئەکات ، وە ئەگەر بەڵێن بدات نایباتە سەر ، وە ئەگەر پەیمان ببەستێ غەدر و خیانەت ئەکات، وە ئەگەر کێشە و جیاوازی لەگەڵ کەسێک هەبێ ئەوا لەحەق لائەداو درۆ ئەکات) .

**١٤** - عبداللە ی کوڕی عەمری کوڕی عاص رضي الله عنهما ئەفەرموێ : سێ (سیفەت) هەن ئەوەی تیایدابن ئەوا موناڤیقە : ئەوەی کە قسەی کرد درۆ بکات، وە ئەوەی کە بەڵێنی داو ئەیشکاند، وە ئەوەی بەئەمین دانراو خیانەتی کرد، لەپاشاندا ئەم ئایەتە پیرۆزانەی خوێندەوە : | وَمِنْهُم مَّنْ عَاهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ . . . | تا کۆتایی ئایەتەکان .

**١٥** - عبداللە ی کوڕی عەمر رضي الله عنهما ئەفەرموێ : سێ شت هەن گەر لە هەر بەندەیەکدا هەبن ئەوا لەسەرت قورس نەبێت بەوەی شایەتی لەسەر بدەی کە موناڤیقە، ئەگەر قسەی کرد درۆ ئەکات وەئەگەر بەڵێن بدات نایباتە سەر، وە ئەگەر بەدەستپاک و ئەمین دانرا خیانەت ئەکات ، وە

ئەوەی کە قسەی کرد ڕاستگۆ بوو ، وە کە بەڵێنی ئەدا ئەیبردەسەر ، وە کە بە دەستپاک دائەنرا (ڕاسپاردەی پێ ئەدرا) جێەجێی ئەکرد (خیانەتی تێدا نەئەکرد)، ئەوا لات قورس نەبێ بەوەی شایەتی بدەی کە ئیماندارە .

١٦ - هارون بن زیاب ئەڵێت : کاتێک عبداللە ی کوڕی عەمر رضي اللە عنهما لەسەرەمەرگ دابوو پیاوێک (پێشتر) خوازبێنی کچەکەی لێ کردبوو، جا وتی : بەڕاستی من قسەیەکم تێداکردووە کە لە عیددە ئەچێت ، وە بێگومان من پێم ناخۆشە کە بە سێ یەکی نیفاق بگەڕێمەوە لای اللە عز وجل .

---

: ڕوونکردنەوە : و اتە پێشتر عبداللە رضي اللە عنە قسەیەکی کردووە لەگەڵ ئەم کابر ایە وەکوو ئەوەی پێی گوتبێ کچەکەمت پێ ئەدەم ، جا بۆ ئەوەی بێ وەعد دەرنەچێ و مەترسی نیفاقی نەکەوێتە سەرکچەکەی دا پێی .

١٧ - هارون ئەڵێت : کاتێک عبداللە ی کوڕی عەمر رضي اللە عنهما لەسەرەمەرگ دابوو وتی : فلان کەسم بۆ ئاگادار بکەنەوە - کە پیاوێکی قوڕەیشی بوو - چونکە من سەبارەت بە کچەکەم قسەیەکم لەگەڵ کردووە هاوشێوەی عیددە، حەزناکەم بە سێ یەکی نیفاق بگەڕێمەوە لای اللە، جا ئێوە شایەت بن کە بێگومان لێم مارەکرد و پێم بەخشی .

١٨ - أبو أمامة الباهلي رضي الله عنه ئەفەرموێ : کەسێ موونافیق ئەگەر قسەی کرد درۆ ئەکات ، وە ئەگەر بەڵێن بدات نایباتە سەر، وە ئەگەر بەدەستپاک و ئەمین دانرا خیانەت ئەکات، وە لەکاتی دابەشکردنی دەسکەوتی جەنگ نادادپەروەری ئەکات، وە ئەگەر فەرمانی (بەچاکە) پێ بکرێت گوێڕایەڵ نابێت، وە ئەگەر لەجەنگ ڕوبەڕووی دوژمن ببێتەوە ترسنۆکە، جا ئەگەر ئەوانەی تێدابێت ئەوا هەموو بەشەکانی نیفاقی (کردەیی) تێدایە، وە ئەگەر هەندێکی تێدابن ئەوا بەشێک لە نیفاقی تێدایە.

١٩ - هەمان شتە وەکوو فەرموودەی یازدەیەم .

٢٠ - ئیمامی شەعبی رحمه الله ئەفەرموێ : ئەوەی درۆ بکات ئەوا موونافیقە، پاشان وتی : نازانم کامەیان زیاتر ئەچنە ژێرەوەی ئاگر، درۆ یان ڕەزیلی .

٢١ - عمرانی کوڕی حصین رضي الله عنه ئەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (بەڕاستی زۆرترین شتێک کە لێتان بترسێم لەدوای خۆم هەموو موونافیقێکی زمان لووس و قسەزانە) .

٢٢ - أبو عثمان النهدي ئەڵێت : لای عومەری کوڕی خطاب بووم رضي الله عنه گوێم لێبوو لە ووتارەکەی فەرمووی : گوێم لە پێغەمبەر بوو ﷺ ئەیفەرموو : (بەڕاستی زۆرترین شتێک کە لێی بترسێم لەسەر ئومەتەکەم هەموو موونافیقێکی زمان لووس و قسەزانە) .

**٢٣** - أبو عثمان النهدي ئەڵێت : گوێم لە عومەری کوڕی خطاب بوو رضي الله عنه لە خوطبە فەرمووی : پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری کردوینەتەوە لە هەموو مونافیقێکی زمان لووس و قسەزان .

**٢٤** - أبو عثمان النهدي ئەڵێت : بەئەندازەی ژمارەی پەنجەکانم گوێم لێبووە عومەری کوڕی خطاب رضي الله عنه لەسەر مینبەر ئەیفەرموو : بەڕاستی زۆرترین شتێک کە لێی بترسێم لەسەر ئەم ئوممەتە : مونافیقێکی زۆرزانە، پێی وترا : مونافیقی زۆر زان چۆنە ؟

فەرمووی : زانایە لە قسەکردن و زوبانی وە نەزانە بە دڵ و کردەوە .

---

**ڕوونکردنەوە : واتە کردەوە ناکات بەوەی کە دەیڵێت وە دڵی پێچەوانەی زوبانیەتی .**

**٢٥** - ئەحنەفی کوڕی قەیس ئەڵێت : چوومە لای عومەری کوڕی خطاب ساڵێک لای خۆی هێشتمیەوە، جا فەرمووی : ئەی ئەحنەف بێ گومان من تاقیم کردییەوە جا بینیم ڕووکەش و ئاشکراییەکەت چاک و باشە ، وە من هیوام وایە نهێنی و شاراوەییت وەکو ڕووکەشت وابێ ، ئێمە پێشتر وتوومانە : بێگوومان ئەم ئوممەتە بەهیلاک چوو بەهۆی مونافیقە زۆر زانەکان .

**٢٦** - مطلبی کوڕی عبدالله ی کوڕی حنطب ئەڵێت : ئیمامی عومەر رضي الله عنه فەرمووی : سەبارەت بە دوو پیاو لێتان ناترسم، پیاوێک کە ئیماندار بێ و ئیمانی تیادا بەدەر کەوتبێ، وە پیاوێک کافر بێ و کوفرەکەی بەدەر کەوتبێ، بەڵام سەبارەت بە پیاوێک لێتان ئەترسێم کە خۆی ئەداتە پاڵ ئیمان و کردەوە بە پێچەوانەی ئەکات .

**٢٧** - زیادی کوڕی حدیر ئەڵێت : ئیمامی عومەر رضي الله عنه فەرمووی : بەڕاستی زۆرترین شتێک کە لێی بترسێم لەسەرتان سێ شتە : مونافیقێک کە قورئان بخوێنێتەوە نە واوێک و نە ئەلیفێکی تیادا جێناهێڵێ بەڵام موناقەشەو دەمەدەمێ خەڵکی ئەکات گوایە لەوان زاناترە تاوەکو گومڕایان بکات و لایان بدات لەسەر هیدایەت، وەهەروەها زەللەو هەلخلیسکانی زانا و عالم، وە پێشەوا گومڕاکارەکان .

**٢٨** - وەکو ئەسەری پێشوو هەمان شتە .

**٢٩** - ئیمامی عومەر رضي الله عنه ئەفەرموێ : سێ شت ئیسلام ئەڕوخێنێ و لەناوی ئەبات : زەللە و هەلخلیسکانی زانا و عالم، موناقەشەو دەمەدەمێ کردنی مونافیق بە قورئان، وە پێشەوا گومڕاکارەکان .

**٣٠** - عقبەی کوڕی عامر رضي الله عنه ئەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرموی : (زۆربەی مونافیقی ئومەتەکەم قورئان خوێنەکانن) .

**٣١** - هەمان شتە وەکو فەرموودەی پێش خۆی .

**٣٢** - لە عقبەی کوڕی عامر رضي الله عنه، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (زۆربەی مونافیقی ئەم ئومەتە قورئان خوێنەکانن) .

**٣٣** - لە عقبەی کوڕی عامر رضي الله عنه، لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەفەرموێ : (زۆربەی مونافیقی ئومەتەکەم قورئان خوێنەکانن) .

**٣٤** - عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص رضي الله عنهما ئەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (زۆربەی مونافیقی ئومەتەکەم قورئان خوێنەکانن) .

**٣٥** - هەمان شتە وەکو فەرموودەی پێشتر .

**٣٦** - أبو موسای ئەشعەری رضي الله عنه ئەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (نموونەی ئەو ئیمانداراەی کە قورئان دەخوێنێتەوە وەکو ئوتورجە (بەهێ) وایە هەم بۆنی خۆشە و هەم تامی ، وە نمونەی ئەو ئیمانداراەی کە قورئان ناخوێنێتەوە وەکو خورما وایە بۆنی نیە بەڵام تامی شیرینە ، وە نموونەی ئەو مونافیقەی کە قورئان ئەخوێنێتەوە وەکو ڕەیحان وایە بۆنی خۆشەو تامی تاڵە ، وە نموونەی ئەو مونافیقەی کە قورئان ناخوێنێتەوە وەکو گوژاڵک وایە بۆنی نیەو تامی تاڵە) .

**٣٧** - هەمان شتە وەکوو فەرموودەی پێشتر .

**٣٨** - أبو موساى ئەشعەری رضي الله عنه ئەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (نموونەی ئەو ئیماندارەی کە قورئان دەخوێنێتەوەو کردەوەی پێ ئەکات وەکو ئوتورجە (بەهێ) وایە هەم بۆنی خۆشە هەم تامی ، وە نمونەی ئەو ئیماندارەی کە قورئان ناخوێنێتەوە وەکو خورما وایە بۆنی نیە بەڵام تامی شیرینە ، وە نموونەی ئەو مونافیقەی کە قورئان ئەخوێنێتەوە وەکو ڕەیحان وایە بۆنی خۆشەو تامی تاڵە ، وە نموونەی ئەو مونافیقەی کە قورئان ناخوێنێتەوە وەکو گوژاڵک وایە بۆنی نیەو تامی تاڵە) .

**٣٩** - يزيد بن عميرة کە لە هاوەڵانی معاذی کوڕی جەبەلە رضي الله عنه ئەفەرموێ : موعازی کوڕی جەبەل لە هەر کۆڕ و مەجلیسێک دانیشتبا ئەو کاتەی دائەنیشت ئەیفەرموو : الله حاکمێکی دادپەروەرە ناوی گەورەو و پیرۆزە ، ڕارا و دوو دڵەکان تیاچوون .

موعاذی کوڕی جەبەل ڕۆژێکیان فەرمووی : بەڕاستی لەدوای ئێوە فیتنە گەلێک سەر هەڵ ئەدەن کە ماڵ و سامان تیایدا زۆرەبێ، خەڵکی ڕوو ئەکەنە قورئان تاوەکو ئیماندار و مونافیق و پیاو و ئافرەت و منداڵ و بەتەمەن و ئازاد و کۆیلە ئەیخوێننەوە و دەستی پێوە ئەگرن .

جا نزیکە کەسێک بڵێت : ئەوە خەڵکی چیانە بۆچی شوێنم ناکەون خۆ بێ گوومان قورئانم خوێندەوە؟ ئەوان شوێنم ناکەون تاوەکو شتێکی تریان بۆ دانەهێنم .

(معاذ فەرمووی) بۆیە ئاگاداری داهێنراوەکان بن، چونکە هەموو داهێنراوێک گومڕاییە، وە ئاگادارتان ئەکەمەوە لە لادان و سەرپێچی کەسی دانا و زانا، چونکە جاری وا هەیە شەیتان وتەیەکی گومڕایی ئەڵێت لەسەر زوبانی کەسی داناو زانا، وە جاری واش هەیە کەسی مونافیق قسەی حەق و ڕاست ئەکات .

**٤٠** - هەمان شتە وەکو فەرموودەی پێشتر .

**٤١** - حکیمی کوڕی جابر ئەڵێت : حذيفة رضي الله عنه فەرمووی : بەڕاستی لە خوێنەرترین کەسەکان بۆ قورئان مونافیقێکە کە نە واوێک و نە ئەلیفێک جێناهێڵێ، ئەیخوێنێتەوەو زمانی لول ئەکات پێوەی هەر وەک چۆن مانگا زمانی لوول ئەکات و خواردنی پێ هەڵ ئەگرێ .

**٤٢** - معاوية الهذلي رضي الله عنه ئەفەرموێ : بەڕاستی مونافیق نوێژ ئەکات بەڵام الله عز وجل بەدرۆی ئەخاتەوە، وە ڕۆژوو ئەگرێ بەڵام الله عز وجل بەدرۆی ئەخاتەوە، وە خێر و صەدەقە ئەکات بەڵام الله عز وجل بەدرۆی ئەخاتەوە، وە جیهاد ئەکات بەڵام الله عز وجل بەدرۆی ئەخاتەوە، وە شەڕ و کوشتار ئەکات و هەر بەردەوام ئەیکات بەڵام ئەخرێتە ناو ئاگرەوە.

---

**ڕوونکردنەوە : واتە هیچی لێ قبوڵ ناکرێ چونکە کوفر لەناو دڵی دایە یان بۆ مەبەستی دوونیایی ئەیکات و بۆ ڕازیکردنی الله نایکات .**

٤٣ - سەبارەت بەم ئایەتە پیرۆزە : ﴿ أَرَءَيۡتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ... ﴾ (سُورَةُ الفُرقَانِ : ٤٣)

واتە : ئایا نابینیت ئەو کەسەی هەواو ئارەزووی خۆی کردۆتە پەرستراوی خۆی.

حەسەنی بەصری رحمه الله ئەفەرموێ : ئەمە باسی مونافیق و دووڕووە حەز و ئارەزووی بۆ هەر شتێک بڕوات ئەنجامی ئەدات .

٤٤ - سەبارەت بەم ئایەتە : ﴿ أَفَرَءَيۡتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ... ﴾ (سُورَةُ الجَاثِيَةِ : ٢٣)

قەتادە رحمه الله ئەفەرموێ : ئەگەر حەز و ئارەزوی داوای شتێکی کرد ئەوا ئەنجامی ئەدات .

٤٥ - مالیکی کوڕی دینار رحمه الله ئەفەرموێ : لە زەبوور خوێندوومەتەوە : بەهۆی خۆبەگەورە زانینی کەسی دووڕوو کەسی هەزار ئەسوتێ .

وە لە زەبوور خوێندوومەتەوە : (من تۆڵە بۆ مونافیق لە مونافیق ئەسێنم، وە تۆڵە لە هەموو مونافیقەکان ئەسێنم) .

ئەمەش واتای وتەی الله عز وجل ە :

﴿ وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعۡضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعۡضَۢا بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾ (سُورَةُ الأَنعَامِ : ١٢٩)

واتە : بەو شێوەیە هەندێک لەستەمکاران دەکەین بەدۆست و پشتیوانی هەندێکی تریان بەهۆی ئەو کردەوانەوەی ئەنجامیان دەدا .

مالک ئەڵێت : وە لە هەندێک کتێب هاتووە : ئەی ستەمکاران لەگەڵ ئەو کەسانە دامەنیشن کە یاد و زیکرم ئەکەن تاوەکو (ئێوە) واز لە زوڵم و ستەم ئەهێنن، جا بێ گوومان من لەسەر نەفسی خۆم پێویستم کردووە یادی ئەو کەسە بکەم کە یادم ئەکات، جا ئەگەر زیکر و یادی منیان کرد ئەوا بە ڕەحمەتی خۆم یادیان ئەکەم، وە ئەگەر ئێوە باسی من بکەن ئەوا باستان ئەکەم بە لەعنەت و نەفرینی خۆم .

**٤٦** - حەسەنی بەصری رحمه الله ئەفەرموێ : موونافیق هەواو ئارەزووی خۆی ئەپەرستێ، حەز و ئارەزووی بۆ هەر شتێک بڕوات ئەنجامی ئەدات .

**٤٧** - حەسەنی بەسری رحمه الله ئەڵێت : لە نیشانەکانی دوو ڕوویی بریتیە لە جیاوازبوونی دڵ و زوبان، وە جیاوازبوونی ئاشکرایی و پەنهانی، وە جیاوازبوونی ناخ و ڕووکەش .

**٤٨** - حەسەن ئەڵێت : گوتراوە : دوو ڕوویی بریتیە لە جیاوازبوونی ئاشکرایی و پەنهانی ووتەو کردەوەو ناخ و ڕووکەش، وە گوتراوە ئەوەی کە نیفاق و دوو ڕوویی لەسەر بنیات نراوە بریتیە لە : درۆ .

**٤٩** - حەسەن ئەڵێت : بەڕاستی خەڵکی تەنها سێ بەشن، ئیماندار و مونافیق و کافر، بەڵام ئیماندار کار ئەکات بەوەی کە فەرمان و طاعەتی الله یە، وە کافریش الله تعالی زەلیلی کردووە هەر وەکو بینیوتانە، بەڵام مونافیق لێرەو لەوێ خۆی دەبینێتەوە، لە کون و کەلەبەر و ماڵ و ڕێگاکانە پەنا بە الله، والله ئەوان خوای خۆیان نەناسیوە بەڵکو ئینکاری کردنی خوای خۆیان ناسیوەو فێری بوون بەهۆی کردەوە پیسەکانیان، توندی و وشکی سەری هەڵداوەو زانست کەم بووە و سوننەت تەرک کراوە فإنا لله وانا إليه راجعون .

سەرگەردان و سەرخۆشن، نە جولەکەن و نە گاور وە نە مەجوسین تاوەکو عوزریان پێ بدرێت (وەکو ذیمی) .

پاشان وتی : بەڕاستی ئیماندار دینەکەی لە خەڵکی وەرنەگرتووە بەڵکو لەلای الله عز وجل بۆی هاتووە و ئەویش وەری گرتووە، بەڵام مونافیق زمانی ئیش پێدەکات بۆ خەڵکی و دڵی ڕێگری دەکات لەوەی کردەوە ئەنجام بدات، دوو کەس شتی تازەیان داهێناوە لە ئیسلامدا، پیاوێک ڕاو بۆچونێکی خراپی هەیەو بانگەشەی ئەوە دەکات بەهەشت بۆ ئەو کەسانەیە کە هەمان بۆچونی ئەویان هەبێت، هەر بۆیە شمشێرەکەی هەڵ ئەکێشێ و خوێنی موسڵمانان ئەڕێژێ و ماڵ و خێزانیان بە حەڵاڵ ئەزانێت بۆ خۆی، وە کەسێکی خاوەن نازو نیعمەت کە دونیا ئەپەرستێ و

لەسەری تورە ئەبێ و شەڕی بۆ ئەکات و داوای ئەکات، پاشان گوتی : ئەی سبحان الله ! ئەم ئومەتەم بینی کە چۆن مونافیقەکان بەسەریدا زاڵ بوون و کاریگەریان هەبوو لەسەری، وە بینیم ئەو کەسانەش کە لەدین دەرچوون چۆن لەم ئومەتە دەرچوون (بە کوشتن و تاڵانکردنیان)، ئەم دوو تاقمە پیسە(مونافیق و خەواریج) جێی خەم و خەفەتی هەموو موسڵمانێکن، ئەی نەوەی ئادەم دینەکەت .... دینەکەت (ئاگاداری بە) چونکە بەهۆیەوە خوێن و گۆشتت پارێزراوە، جا ئەگەر تەسلیمی دینەکەت بی ئای چی ئارامی و چی نیعمەتێکە، بەڵام ئەگەر ئەوەی تریان بێت و تەسلیمی نەبی پەنا بە الله، بەڕاستی ئاگرێکە ناکوژێتەوەو بەردێکە سارد نابێتەوەو نەفسێکە کە نامرێت .

**٥٠** - ضەحاکی کوڕی عبدالرحمان ئەڵێت : بیستم بیلالی کوڕی سەعد ئەی گوت : مونافیق قسەی چاک ئەکات و کردەوەی خراپ ئەنجام ئەدات .

**٥١** - حوذەیفە رضي الله عنه فەرمووی : ئەو مونافیقانەی ئێستا لەناوتان دان خراپترن لە مونافیقەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ، (أبو وائل) ئەڵێت : گوتمان : ئەی باوکی عبدالله واتە چۆن ؟

ووتی : ئەوان نیفاقەکەیان ئەشاردەوە بەڵام

ئەمانە ئاشکرای ئەکەن و ڕای ئەگەیەنن .

**٥٢** و **٥٣** - هەمان شتە وەکو ئەثەری پێشوو .

**٥٤** - حوذەیفە رضي الله عنه فەرمووی : ئەو مونافیقانەی ئێستا لەناوتان دان خراپترن لە مونافیقەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ ، (أبو وائل) ئەڵێت : ووتیان : واتە چۆن ؟

ووتی : ئەوانەی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ ئەیانشاردەوە بەڵام ئەمانەی ئەم ڕۆژگارە ئاشکرای ئەکەن .

**٥٥** - حوذەیفە رضي الله عنه فەرمووی : ئێوە لەم ڕۆژگارەدا لە غەزاکانتان پشت بە مونافیقەکان ئەبەستن .

**٥٦** - أبو البختري ئەڵێت : پیاوێک گوتی اللهم مونافیقەکان لەناو ببە، حوذەیفە رضي الله عنه ووتی : ئەگەر لەناو بچن ئەوا ژمارەتان ناگاتە نیوەی دوژمنەکانتان .

**٥٧** - حية بن جوين ئەڵێت : ئێمە لەگەڵ سەلمان رضي الله عنه بووین لە غەزایەکدا، سەلمان گوتی : ئەوانە موشریکەکانن کە دوژمنن، وە ئەمانە ئیماندارەکانن و ئەمانەی تریش مونافیقەکانن، جا الله عز وجل ئیمانداران بەهێز ئەکات بە هۆی هێز و قووەتی مونافیقەکان، وە الله مونافیقەکان سەر ئەخات بەسەر موشریکەکان بەهۆی پاڕانەوەی ئیمانداران .

**٥٨** - عومەری كوڕی عبدالعزیز رحمه الله چووه سەردانی أبو قلابة پێی گوت : ئەی أبا قلابة بەهێز و توند و تۆڵ بە، مونافیقەكانمان پێ دڵ خۆش مەكە .

**٥٩** - أیوب السختیاني رحمه الله ئەڵێت : أبو قلابة لە شام نەخۆش كەوت عومەری كوڕی عبدالعزیز چووە لای و پێی گوت : ئەی أبا قلابة بەهێز و توند و تۆڵ بە مونافیقەكانمان پێ دڵ خۆش مەكە .

**٦٠** - وەهبی كوڕی مونەبیھ ئەڵێت : سیفەتەكانی مونافیق ئەمانەن : سڵاوكردنی نەفرەتە، خواردنی بەرتیل و حەرامە، دەسكەوتی جەنگی بە فرِت و فێڵەوەیە، لەڕۆژدا بە هات و هاوارە، بەڵام لە شەودا كپ و بێ دەنگە.

---

**ڕوونكردنەوە : ئەم دوو دێڕەی كۆتایی مەبەستی لەوەیە كە بە شەو كت و ماتن و عیبادەت ناكات بەڵام بەڕۆژ خەریكی دەنگ بەرز كردنەوەن بە موناقەشەو كێشە نانەوە .**

**٦١** - حەبیبی كوڕی فضالة رحمه الله ئەڵێت : هەندێك لە موهاجیرەكان ئەیان گوت : واللهِ لە موسڵمان و لە كافر ناترسێم، موسڵمان ئیسلامەكەی ڕێگری لێدەكات، وە كافریش الله عز وجل زەلیلی كردووە، بەڵام چی لە مونافیق بكەم؟

**٦٢** - عورِوەی کوڕی زوبەیر رحمهما الله ئەڵێت : چوومە لای عبدالله ی کوڕی عومەر رضي الله عنهما پێم گوت : ئەی باوکی عبدالرحمان ئێمە لای پێشەواکانمان دائەنیشین کە قسەیەک ئەکەن سوور ئەزانین کە پێچەوانەی حەقە بەڵام بەڕاستیان دائەنێین، وە بە پێچەوانەی حەق حوکم ئەکەن ئێمەش دانی پیا ئەنێین و کارەکەیان بە باش وەسف دەکەین، ئایا تۆ ئەمە چۆن ئەبینی، گوتی : ئەی کوڕی برام ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ ئەم کارەمان بە دووڕوویی هەژمار ئەکرد، بەڵام نازانم لای ئێوە چۆن چۆنیە.

**٦٣** - عبدالرحمانی کوڕی ئیبراهیم هەمان شتی گێڕایەوە .

**٦٤** - عبدالله ی کوڕی عومەر رضي الله عنهما کەسانێکی بینی کە دەچوونە ناو مزگەوت ، گوتی : ئەمانە لەکوێوە دێن .

گوتیان : لەلای ئەمیرەوە .

گوتی : ئایا ئەگەر خراپەیەک ببینن ڕێگری لێ ئەکەن وە ئەگەر چاکەیەک ببینن فەرمانی پێ ئەکەن .

گوتیان : نەخێر .

گوتی : ئەی چی ئەکەن ؟

گوتیان : مەدحی ئەکەن بەڵام کاتێک لەلای ئەچنە دەرەوە جنێوی پێ ئەدەن .

إبن عمر گوتى : بەڕاستى ئێمە لەسەردەمى پێغەمبەر ﷺ شتى لە خوارووى ئەوەمان بە دووڕوويى هەژمار ئەكرد .

**٦٥** - أبي الشعثاء ئەڵێت : كەسانێك چوونە لاى عبدالله ى كوڕى عومەر رضي الله عنهما كەوتنە قسە گوتن بە يەزيدى كوڕى موعاويە، عبدالله پێى گوتن : ئەمە قسەكردنى ئێوەيە لاى من، ئايا ڕووبەڕووشيان ئەم قسانە ئەكەن .

گوتيان : نەخێر .

بەڵكو مەدحيان ئەكەين و پيايان هەڵ ئەدەين .

إبن عمر گوتى : ئەمە لاى ئێمە نيفاقە .

**٦٦** - موهاجرى كوڕى حەبيب ئەڵێت : عيساى كوڕى مەريەم (عليه السلام) ئەيفەرموو : ئەو كەسەى نوێژ ئەكات و ڕۆژوو ئەگرێت بەڵام واز لە تاوان و هەڵە ناهێنێ ئەوا بە درۆزن ناوى ئەنوسرێت .

**٦٧** - حەسەن ئەڵێت : موونافيق ئەو كەسەيە ئەگەر نوێژى كرد مەبەستى پێ ڕووپامايية، وە ئەگەر فەوتاندى ئەوا بۆى دڵتەنگ نابێ، وە زەكاتى ماڵى نادات .

**٦٨** - أبو يحيى ئەڵێت : پرسيار لە حوذەيفە رضي الله عنه كرا موونافيق كێ يە ؟

گوتی : ئەو کەسەیە وەسفی ئیسلام ئەکات بەڵام کردەوەی پێ ناکات .

**٦٩** - أبو أمامة رضي الله عنه ئەفەرمووێ : ئیماندار لەم دونیایە لەنێوان کافرێک دایە کە ئەیکوژێ، وە مونافیقێک کە ڕقی لێ ئەبێتەوە، وە ئیماندارێک کە ئیرەیی پێ ئەبات، وە شەیتانێک کە لەگەڵی دایە و بۆی ڕاسپێردراوە .

**٧٠** - بە حەسەن رحمه الله گوترا : خەڵکی ئەڵێن نیفاق بوونی نییە، حەسەن گوتی : ئەگەر بزانم من بێبەریم لە نیفاق ئەوا پێم خۆشترە نەوەک هەموو زەویم بۆ ببێت بە زێڕ .

## بابى ئەوەى گێڕراوەتەوە سەبارەت بەو کەسەى کە لە نیفاق ئەترسێت و دڵنیا نیە لێى لەسەر نەفسى خۆى

**٧١** - جوبەیرى کوڕى نوفەیر بیستى أبو درداء رضي الله عنه لە کۆتایى نوێژەکەى دواى تەشەهود (تەحیات) زۆر پەناى دەگرت بە الله لە نیفاق، جوبەیر پێى گوت : ئەى أبا درداء تۆ چیتە ، تۆ لەکوێ و نیفاق لەکوێ !

گوتى : وازمان لێ بێنە، وازمان لێ بێنە، چونکە واللهِ پیاو لە ساتێکدا لە دینەکەى هەڵئەگەڕێتەوە و هیچى پێوە نامێنێت .

**٧٢** - جوبەیرى کوڕى نوفەیر ئەڵێت : چوومە ماڵى أبو درداء رضي الله عنه لە شارى حمص، بینیم بە پێوە بوو لە مزگەوتەکەى نوێژى ئەکرد، دواتر دانیشت بۆ تەشەهود و پەناى بە الله ئەگرت لە نیفاق، کە تەواو بوو پێم گوت : الله لێت خۆشبێت أبو درداء تۆ لە کوێ و نیفاق لە کوێ، پلە و پایەى تۆ لە کوێ و نیفاق لە کوێ .

گوتى : اللهم لێم خۆشبە - سێ جار واى گوت - لە بەڵا ئەمین نییە ئەو کەسەى لە بەڵا ئەمینە، واللهِ پیاو لە ساتێکدا تووشى فیتنە ئەبێت و لە دینەکەى هەڵئەگەڕێتەوە .

٧٣ - یەزیدی کوڕی مەرثەد ئەڵێت : لە مەجلیسێکدا بە ئامادەبوونی أبو درداء رضي الله عنه باسی دەجال کرا، نَوف البکالي گوتی : شتێک هەیە کە من زیاتر لە دەجال لێی ئەترسێم .

أبو درداء گوتی : ئەو شتە چیە؟

گوتی : ئەوەیە کە ئیمانم لەدەست بدەم و هەستیشی پێ نەکەم .

أبو درداء گوتی : دایکت ڕۆڕۆت بۆ بکات ئەی کوڕی الکندية مەگەر لەسەر زەوی سەد کەس هەیە لەوە بترسێ کە تۆ لێی ئەترسی؟ پاشان گوتی : دایکت ڕۆڕۆت بۆ بکات ئەی کوڕی الکندية مەگەر لەسەر زەوی پەنجا کەس هەیە لەوە بترسێ کە تۆ لێی ئەترسی؟ پاشان گوتی : وە سی کەس؟ پاشان گوتی : وە بیست؟ پاشان گوتی : وە دە؟ پاشان گوتی : وە پێنج؟ پاشان گوتی : وە سێ؟ هەموو جارێکیش ئەی گوت : دایکت ڕۆڕۆت بۆ بکات ، پاشان گوتی : سوێند بەو زاتەی نەفسی منی بەدەستە هەر بەندەیەک لە ئیمانی خۆی دڵنیا بێت ئەوا ئیللا دای ئەکەنێت و لەدەستی ئەدات ، سوێند بەو زاتەی نەفسی منی بەدەستە ئیمان وەکو قەمیسێک وایە جارێک بیکەیتە بەرت و جارێک دای بکەنی و وازی لێ بهێنی .

٧٤ - ئەسلەمی کوڕی عیمڕان ئەڵێت : بیستم أبو ئەیوبی ئەنصاری رضي الله عنه دەی گوت : سەردەمانێک بەسەر پیاودا دێن کە بە ئەندازەی

نوكی دەرزی نیفاق لە پێستیدا نیە، بەڵام کات و باری تری بەسەردا دێن کە بە ئەندازەی نوکە دەرزییەک ئیمان لە دڵیدا نییە .

**٧٥** - دووبارەیە وەکو **٧٤** بەسەنەدی جیاواز .

**٧٦** - عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص رضي الله عنهما ئەفەرمووێ : پێشتر نیفاق نامۆ بوو لەناو ئیماندا، بەڵام نزیکە ئیمان نامۆ ببێت لەناو نیفاقدا .

**٧٧** - إبن لهيعة هەمان شتی گێڕایەوە بە سەنەدی خۆی .

**٧٨** - أبو ئیدریسی خەولانی ئەڵێت : هەر بەشەرێک لەسەر ڕووی زەوی نەترسێ لەوەی ئیمانی لەدەست بدات، ئەوا ئیللا لەدەستی ئەدات .

**٧٩** - أبو عثمان ئەڵێت : گوتم بە أبو رجاء العطاردي ئایا گەیشتووی بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کە لە نیفاق بترسێن لەسەر نەفسی خۆیان؟ لە کاتێکدا گەیشتبوو بە عومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه ،

گوتی : بە فەزڵی الله گەیشتم بە سەردەمێکی چاک و باش (لە هاوەڵان)، بەڵێ زۆر بە توندی، بەڵێ زۆر بەتوندی (ئەترسان لەنیفاق) .

**٨٠ -** حەسەن رحمه الله دەی گوت : هاوەڵان کاتێک بینیان کە نیفاق ئیمان لەناو ئەبات و لای ئەدات، هیچ خەم و خەفەتێکیان نەبوو جگە لە نیفاق .

**٨١ -** حەسەن رحمه الله ئەڵێت : کاتێک باسکرا کە نیفاق ئیمان لەناو ئەبات و لای ئەدات، هیچ شتێکیان بە ئەندازەی ئەو لەلا مەترسیدارتر نەبوو .

**٨٢ -** أبو هلال ئەڵێت : ئەبان پرسیاری لە حەسەن کرد : ئایا لە نیفاق ئەترسی؟

گوتی : چی ئەمینم ئەکات لە کاتێکدا عومەر رضي الله عنه ئەترسا .

**٨٣ -** بە حەسەن گوترا : خەڵکانێک بانگەشە ئەکەن نیفاق بونی نیە یان ناترسێن لە نیفاق، حەسەن گوتی : واللّٰهِ ئەگەر بزانم من بێبەریم لە نیفاق ئەوا پێم خۆشترە نەوەک هەموو زەویم بۆ ببێت بە زێڕ .

**٨٤ -** إبن موسى البصري ئەڵێت : بیستم موعاویەی کوڕی قورە دەی گوت : ئەگەر نیفاقم تیا نەبێ بەلاماوە خۆشەویسترە لە دونیاو ئەوەی تیایەتی، عومەر رضي الله عنه لێی ترساوە جا من لێی دڵنیا بم؟

**٨٥ -** موعەللای کوڕی زیاد ئەڵێت : حەسەن لەم مزگەوتە سوێندی خوارد بە الله ئەو زاتەی کە هیچ پەرستراوێک بە حەق نیە ئەو نەبێت، گوتی :

هیچ ئیمانداریک نەمردووە وە هیچ یەکێکیان نەماوە لە ژیاندا ئیللا لە نیفاق ترساون، وە هیچ مونافیقێک نەمردووە وە هیچ یەکێکیان نەماوە لە ژیاندا ئیللا لە نیفاق دڵنیا بووەو لێی نەترساوە، وە ئەی گوت : ئەوەی لە نیفاق نەترسێ ئەوا مونافیقە .

**٨٦** - ئەیوب ئەڵێت : بیستم حەسەن رحمه الله دەی گوت : واللهِ هیچ ئیمانداریک نیە بەیانی و ئێوارەی بەسەردا بێت ئەوا ئیللا لە نیفاق ئەترسێ لەسەر نەفسی خۆی .

**٨٧** - محمدی کوڕی سیرین رحمه الله ئەڵێت : هیچ شتێک هێندەی ئەم ئایەتە نامترسێنێ : الله عز ووجل دەفەرمووێ : | وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ | (سُورَةُ البَقَرَةِ : ٨)

واتە : وە لەناو خەڵکیدا هەندێ کەس هەیە کە دەڵێ: بڕوامان هێناوە بە الله و بەڕۆژی دوایی لەکاتێکدا ئەوان ئیماندار نین .

**٨٨** - عەمری کوڕی ئەسوەدی عەنسی رحمه الله کاتێک ئەچوو بۆ مزگەوت بە دەستی ڕاستی دەستی چەپی ئەگرت، پرسیاری ئەمەی لێکرا گوتی:

لە ترسی ئەوەی دەستم نیفاق و دووڕیی بکات .

**: ڕوونكردنەوە : مەبەستی لەوەیە دەستی خۆی گرتووە بۆ ئەوەی وا دیارنەكەوێ كە بە فیزوكیبرەوە ڕێ ئەكات .**

**٨٩** - ئەوزاعی ئەڵێت : بیستم بیلالی كوڕی سەعد رحمه الله دەی گوت : مەبە دۆست و وەلی الله لە ئاشكرایی وە دوژمنی لە پەنهانی .

**٩٠** - عبدالرحمانی كوڕی مەهدی و سەلامی كوڕی أبي مُطيع ئەڵێن : پیاوێكی مورجیئە لای ئەیوب السختیانی رحمه الله ئەی گوت : تەنها كوفر و ئیمان بونیان هەیە، (سەلام ) گوتی : ئەیوب بێدەنگ بوو، پاشان ئەیوب ڕووی تێكرد و گوتی : ئەم فەرمایشتەی الله ت بینیوە : | وَءَاخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ ٱللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ | (سُورَةُ التَّوبَة : ١٠٦)

واتە : وە ئەو كەسانەی تر كە دواخران بۆ فەرمان و بڕیاری الله یان سزایان دەدات یان پەشیمانیان لێ وەردەگرێت

ئایا ئەوانە ئیماندارن یان كافر؟

گوتی : پیاوەكە بێدەنگ بوو، پاشان ئەیوب گوتی : بڕۆ قورئان بخوێنەوە چونكە هەر ئایەتێك باسی نیفاقی تیادا كرابیت لە قورئان ئەوا من لێی ئەترسم لەسەر نەفسی خۆم .

**٩١** - ئیمامی سوفیانی ثەوری رحمه الله ئەڵێت : خیلافی نێوان ئێمە و مورجیئە سێ شتە :

ئێمە ئەڵێین : ئیمان وتەو کردەوەیە .

ئەوان ئەڵێن : تەنها وتەیە بەبێ کردەوە .

وە ئەڵێین : ئیمان زیاد و کەم ئەکات .

ئەوان ئەڵێن : زیاد و کەم ناکات .

وە ئێمە ئەڵێین : نیفاق هەیە .

ئەوان ئەڵێن : نیفاق بونی نیە .

**٩٢** - عومەری مەولای غەفرە ئەڵێت : دوورترین کەس لە نیفاق وە کەسێک کە زۆر بە توندی لێی ئەترسێ ئەو کەسەیە کە وا ئەزانێت هیچ شتێک لە نیفاق دەربازی ناکات، وە نزیکرین کەس لە نیفاق ئەو کەسەیە کە کاتێک بەپاک دائەنرێ لێی دڵی ئۆقرە ئەگرێ و قبوڵی ئەکات .

ووتی : وە ئەڵێت : ئەگەر تەزکیە و وەسف کرای بە شتێک کە تیاتدا نەبوو ئەوا بڵێ : اللهم لێم خۆشبە لەوەی کە ئەوان نایزانن و لێم مەگرە بەوەی کە دەیڵێن، چونکە بەڕاستی تۆ ئەزانی و ئەوان نازانن .

**٩٣** - ئیبراهیمی تەیمی ئەڵێت : هەر جارێک وتەو کردەوەم بەراورد بەیەک کردبێ، ئەوا ترساوم کە خۆم بەدرۆ بخەمەوە .

**٩٤** - حمید و حبیبی کوڕی الشهید دەڵێن کەوا ئیمامی حەسەنی بەسرِی لەبارەی ئەم ئایەتەوە | هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ (١٩) إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ حِسَابِيَهۡ (٢٠) | (سُورَةُ الحَاقَّةِ)

گوتی : ئیماندار گومانی باش بە پەروەردگاری ئەبات بۆیە کردەوەی چاکە ئەکات، وە مونافیق گومانی خراپ بە پەروەردگاری ئەبات بۆیە کردەوەی خراپە ئەکات .

**٩٥** - عبدالرحمانی کوڕی عەمری الأوزاعي ئەڵێت : بەڕاستی ئیماندار کەم قسە ئەکات و کردەوەی زۆرە، بەڵام مونافیق زۆر قسە ئەکات و کردەوەی کەمە .

**٩٦** - خەیثەمە گوتی : کەسانێک ئەزیەت و ئازاری ئەدەن، پاشان گوتی : ئەمانە کە ئازارم ئەدەن واللهِ هەر داوایەکیان کردبێ بۆم جێبەجێ کردون، وە هیچ یەکێکیان لەلای منەوە ئازار نەدراون، کەچی لە سەگی ڕەش زیاتر ڕقیان لەمن دەبێتەوە ئەزانن لەبەر چی؟

چونکە واللهِ بێگومان هەرگیز مونافیق ئیمانداری خۆشنەویستووە .

**٩٧** - ئیمامی سوفیانی ثەوری رحمه الله ئەڵێت : گوتراوە ئەگەر نەفسی خۆت بناسی و شارەزای بی ئەوا زەرەرت لێنادات ئەوەی کە لەسەرت گوتراوە.

**٩٨** - لە أبو هريرەوە رضي الله عنه کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ماڵوێرانی بۆ عەرەبەکان لەو شەڕو خراپەیەی کە نزیک بۆتەوە، فیتنە گەلێک وەکو پارچە شەوی تاریک وان، پیاو بەیانی ئەکاتەوە ئیماندارە بەڵام بۆ ئێوارە کافر ئەبێتەوە، وە ئێوارە ئەکاتەوە ئیماندارە بۆ بەیانی کافر ئەبێتەوە، دینەکەی ئەفرۆشێت بۆ بەشێکی کەمی دونیا، ئەو کەسەی لەو ڕۆژەدا دەست بە دینەکەیەوە بگرێت وەکو ئەوە وایە دەستی گرتبێت بە دڕکو داڵی کەوتو یاخود بە پشکۆی ئاگر .

**٩٩** - لە أبو هريرەوە رضي الله عنه کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (پەلە بکەن لە کاری چاکە پێش ئەوەی کۆمەڵە فیتنەیەکتان بەسەردا بێن کە وەکو پارچە شەوی تاریک وان، پیاو بەیانی ئەکاتەوە ئیماندارە بەڵام بۆ ئێوارە کافر ئەبێتەوە، وە ئێوارە ئەکاتەوە ئیماندارە بۆ بەیانی کافر ئەبێتەوە، دینەکەی ئەفرۆشێت بۆ بەشێکی دونیا) .

**١٠٠** - إسماعيل بن جعفر هەمان شتی گێڕایەوە .

**١٠١** - لە أبو هريرەوە رضي الله عنه کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : پەلە بکەن لە کاری چاکە پێش ئەوەی کۆمەڵە فیتنەیەکتان بەسەردا بێن کە وەکو پارچە شەوی تاریک وان، پیاو بەیانی ئەکاتەوە ئیماندارە بەڵام

بۆ ئێواره كافر ئەبێتەوە، وە ئێوارە ئەكاتەوە ئیماندارە بۆ بەیانی كافر ئەبێتەوە، دینەكەی ئەفرۆشێت بۆ بەشێكی دونیا .

**١٠٢** - لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە رضي الله عنه كەوا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : پێش هاتنی قیامەت فیتنەگەلێك سەر هەڵ ئەدەن وەكو پارچە شەوی تاریك وان، پیاو بەیانی ئەكاتەوە ئیماندارە بەڵام بۆ ئێوارە كافر ئەبێتەوە، وە ئێوارە ئەكاتەوە ئیماندارە بۆ بەیانی كافر ئەبێتەوە، دینەكەی ئەفرۆشێت بۆ بەشێكی دونیا .

**١٠٣** - لە أبو موسای ئەشعەرییەوە رضي الله عنه، لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : پێش هاتنی قیامەت فیتنەگەلێك سەر هەڵ ئەدەن، پیاو بەیانی ئەكاتەوە ئیماندارە بەڵام بۆ ئێوارە كافر ئەبێتەوە، وە ئێوارە ئەكاتەوە ئیماندارە بۆ بەیانی كافر ئەبێتەوە .

**١٠٤** - لە ئەبو ئومامەوە رضي الله عنه، لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : (لە داهاتوودا فیتنەگەلێك سەر هەڵ ئەدەن، پیاو بەیانی ئەكاتەوە ئیماندارە بەڵام بۆ ئێوارە كافر ئەبێتەوە، تەنها ئیماندارێك نەبێت كە الله تعالى پڕی كردبێت لە عیلم و زانست) .

**١٠٥** - أبو عبدالله الأشعري لە أبو درداء رضي الله عنه ئەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمووبوی : (قەومانێك دوای ئیمان هێنان كافر ئەبنەوە،

ئەمە گەیشتە أبو درداء چوو بۆ لای و پێی گوت : ئەی پێغەمبەری الله ﷺ پێم گەیشتووە کە فەرمووتە : قەومانێک دوای ئیمان هێنان کافر ئەبنەوە ؟

فەرمووی : بەڵێ، وە تۆ لەو کەسانە نیت .

١٠٦ - عبدالله ی کوڕی عەمرو رضي الله عنه ئەفەرمووێ : سەردەمانێک بەسەر خەڵکیدا دێت لە مزگەوتەکانیان کۆ ئەبنەوە کەچی هیچ ئیمانداریکیان لەناودا نییە .

١٠٧ - عبدالله ی کوڕی عەمرو رضي الله عنه ئەفەرمووێ : سەردەمانێک بەسەر خەڵکیدا دێت لە مزگەوتەکان کۆ ئەبنەوە کەچی هیچ ئیمانداریکیان لەناودا نییە .

١٠٨ - عبدالله ی کوڕی عەمرو رضي الله عنه ئەفەرمووێ : سەردەمانێک بەسەر خەڵکیدا دێت لە مزگەوتەکان کۆ ئەبنەوە کەچی هیچ ئیمانداریکیان لەناودا نییە .

١٠٩ - عبدالله ی کوڕی مَسعود رضي الله عنه ئەفەرمووێ : جاری وا هەیە یەکێکتان لەماڵەوە ئەچێتە دەرەوە پیاوێک ئەبینێت کە پێویستی پێیە، پاشان پێی ئەڵێت : تۆ ئاوا و ئاوای وە مەدحی ئەکات، لەوانەشە هیچ پێویستیەکی بۆ جێبەجێ نەکات، ئەمجا کە ئەگەڕێتەوە الله عز وجل لێی تووڕە بووە وە هیچ لە دینەکەی نەماوەتەوە لەگەڵی .

١١٠ - أبي مليكة الذماري ئەڵێت : پیاوێ وا هەیە ئەچێتە لای پێشەواو کاربەدەست جا کە دێتە دەرەوە یان موشریکە یان مونافیق، ئەگەر پێی ببەخشێ سوپاسی دەکات ئەو کەسەی (الله عز وجل) ی لەبیر دەچێتەوە کە پێی بەخشیبوو، وە ئەگەر پێی نەبەخشێت ئەچێتە دەرەوە زەمی ئەکات و عەیبداری ئەکات، خۆ ئەگەر ئەمەی کرد لەگەڵ ئیمام ئەوا نیفاق یاخود شیرکی کردووە، چونکە ئەو کەسەی ئەگرێتەوەو ئەبەخشێت هەر الله عز وجل ە .

١١١ - خالیدی کوڕی مەعدان رحمه الله ئەڵێت : ئاگاداری ئەوە بن کە بەفیزەوە ڕێ بکەن، چونکە جاری وا هەیە دەستی پیاو نیفاق ئەکات لەبری بەشەکانی تری جەستەی .

---

: ڕونکردنەوە : ئەثەری ٨٨ بخوێنەوە

١١٢ - لە أم دردائەوە ئەڵێت : کاتێک أبو درداء کەسێکی ئەبینی لەسەر حاڵ و بارێکی باش مردووە ئەی گوت : خۆشبەختی بۆ خۆی خۆزگە منیش وابام.

أم درداء پێی گوت : بۆچی وا دەڵێی ؟

ئەویش گوتی : ئایا دەزانی ئەی ئافرەتی ساویلکە پیاو بەیانی ئیمانداربەو بۆ ئێوارە ئەبێتە موونافیق .

گوتی : واتا چۆن ؟

فەرمووی : ئیمانی لەدەست ئەدات و هەستیشی پێ ناکات، هەر بۆیە لەبەر ئەمە من مردنم پێ خۆشترە نەوەک بەو حاڵەوە بمێنمەوە لەناو نوێژ و ڕۆژوو .

**١١٣** - عبدالرحمان بن إبراهيم الدمشقي هەمان شتی گێڕایەوە .

**١١٤** - إبن شَوذَب ئەڵێت : بە حەسەنی بەسرِی رحمه الله گوترا : ئەی أبو سعيد ئەمڕۆ نیفاق بوونی هەیە؟

گوتی : ئەگەر بێتو (موونافیقەکان) لە ڕێگاوبانەکانی بەسرە دەربچن و بڵاو ببنەوە ئەوا ئێوە بەناموٚیی تیایدا ئەمێننەوە .

**١١٥** - حەسەن رحمه الله ئەڵێت : قیامەت بەرپا نابێت تا وەکو کەسانی موونافیق نەبنە گەورەی قەومەکان .

**١١٦** - حەسەن ئەڵێت : ئیماندار دایمە بە ترساوی و ڕەنگ زەردی ئەبینرێ، وە موونافیق دایمە بە گەشاوەیی ئەبینرێ .

---

ڕوونكردنەوە : مونافیق لە نیفاق ناترسێت و خەمی لێ ناخوات، بەڵام ئیماندار ئەترسێ و خەفەت لەوە ئەخوات نیفاقی هەبێت .

١١٧ - لە عبدالله ی كوڕی عەمرووەوە رضي الله عنه ئەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (چوار خەسڵەت هەن ئەوەی لە خۆیان بگرێ ئەوا مونافیقێكی خاڵس و پاڵفتەیە، ئەگەر قسە بكات درۆ ئەكات، وە ئەگەر بەڵێن بدات ئەیشكێنێت، وە ئەگەر پەیمان ببەستێ نایباتە سەر و غەدر ئەكات، وە ئەگەر كێشەو جیاوازی لەگەڵ كەسێك هەبێت لە حەق لا ئەداو درۆ ئەكات، جا هەر كەسێك یەكێك لەم خەسڵەتانەی تیا بوو ئەوا خەسڵەتێك لە نیفاقی تیایە تاوەكو وازی لێ دەهێنێت) .

١١٨ - عبدالله ی كوڕی عەمرو رضي الله عنه ئەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (چوار خەسڵەت هەن ئەوەی لەخۆیان بگرێ ئەوا مونافیقە، وە ئەگەر یەكێك لەم خەسڵەتانەی تیا بوو ئەوا خەسڵەتێك لە نیفاقی تیایە، ئەگەر قسە بكات درۆ ئەكات، وە ئەگەر بەڵێن بدات ئەیشكێنێت، وە ئەگەر پەیمان ببەستێ نایباتە سەر و غەدر ئەكات، وە ئەگەر كێشەو جیاوازی لەگەڵ كەسێك هەبێت لە حەق لا ئەداو درۆ ئەكات) .

---

: كە ئەفەرمووێ مونافیقە یان مونافیقی خاڵسە مەبەست پێی لە نیفاقی عەمەلیە نەوەک کەسەکە کافربێت .

والحمدلله رب العالمين

والصلاة والسلام علي محمد وعلى أصحابه أجمعين

https://t.me/Israel_Al_Athary

کتێبەکە بە عەرەبی :

https://t.me/salaflibrary/357

# پێڕست